


**ناوی کتیب:** **پوختەی رۆژووی رەمەزان (پەیامی رەمەزان)**

**نوسەر:** **عومەر عەلی**

**دیزاینی ناوەوەو بەرگ:** **توانا ئەحمەد**

**چاپخانە:**

**تیراژ:**

**نرخ:**

**ژمارە (        )ی ساڵی (        )ی**

**لەبەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکانی پێدراوە**

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونتوب إليه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد ألا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه وسلم تسليما كثيرا.

فأوصيكُمْ عبادَ اللهِ، بتقوَى اللهِ تعالَى والعملِ بمَا جاءَ فِي كتابِهِ ، قالَ اللهُ تعالَى:

]يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْس وَاحِدَة وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا[ النساء: ١.

[يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ، ولا تموتن إلا وأنتم مسلمون] ال عمران ١٠٢.

[يَاأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا،يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا] الأحزاب: ٧٠-٧١ .

ئـەم نامیلکـەی کـە لـە بەردەسـتاندایە بریتیـە لـە چەنـد ووتارێـك کـە دەسـتپێدەکات لـە پێـش ڕەمـەزان و خـۆ ئامادەکـردن بـۆی تـا ڕەمـەزان و ئـەو عیبادەتانـەی کـە لەنـاو ڕەمەزانـدا هەیـە تـا کۆتایـی ڕەمـەزان و گرنگـی کۆمەڵـە کارێـك لـە دوای ڕەمـەزان و بەردەوامـی لەسـەر، چونکـە ئاشـکرایە مانگـی ڕەمـەزان و خـۆ حازرکـردن بـۆی پێـش هاتنـی و شـەوانی قـەدرو چۆنێتـی هەسـتان بـۆ جـەژن و شـەش ڕۆژی دوای مانگـی ڕەمـەزان هەمـوو سـاڵێك دووبـارە دەبنـەوە، ئـەم نامیلکـەش بـە ووتـاری جیـا جیـا بـاس و خواسـتی هەموویانـی بـە پلـە پلـە تێدایـە، بـە ئومێـدی سـود وەرگرتـن لێیـان، داواکارم لـە خـوای گـەورە لێمانـی وەرگرێـت، هـەر هەڵـەو کەموکوڕیـەك بەرچاوکـەوت ئـەوە بێگومـان لـە منەوەیـەو چونکـە پەیامـی پاکـی ئیسـلام بـێ کەموکوڕیـە، والسـلام علیکـم ورحمـة اللـه.

# پێش ڕەمـەزان

بـاس کردنــی زۆر شــت بەتایبــەت دینیــەکان زۆرجــار پێویســت بــە وردەکاری نــاکات لەبــەر زۆر دووبــارە بوونەوەیــان، بــەڵام وەك بــە بیرهێنانەوەیـەك ئامـاژە بـە چەنـد شـتێك دەدەیـن لـە سـەر ڕەمـەزان بـە بۆنـەی نزیـك بوونـەوەی ئـەو مانگـە پیـرۆزەوە، وە خـوای گـەورەش دەفەرمـووێ {وَذَكِّـرْ فَـإِنَّ الذِّكْـرَى تَنْفَـعُ الْمُؤْمِنِـينَ}[1]. ئاشـکرایە گرتنــی مانگــی ڕەمــەزان یەکێکــە لــە پایــە گرنگەکانــی ئیســلام وەك لــە فەرموودەیەکـدا هاتـووە لـە وەڵامـی چەنـد پرسـیارێك کـە کابرایەکـی دەشـتەکی لـە پێغەمبـەری کـرد درودی خـوای لـێ بێت{فقـال أخـبرني مـا فرض اللـه علـي مـن الصيـام فقـال شـهر رمضـان}[2] کابـرای دەشـتەکی ووتــی ئـاگادارم بکـە کـە خـوای گـەورە چـی لەسـەر فـەرز کـردووم لـە ڕۆژو، پێغەمبەریـش درودی خـوای لـێ بێـت فەرمـووی مانگـی ڕەمـەزان. وە ئیسـلامەتی هیـچ کـەس تـەواو نابێـت ئەگـەر بـاوەڕی پێـی نەبێـت. وە دەبێــت بیشــی گرێــت مەگــەر عوزرێکــی هەبێــت بەشــێوەیەکی وا کـە لـە شـەرعدا ڕێگـە پێـدراو بێـت وەك: نەخۆشـی، سـەفەر، شـیردەر، حامـل، وە هەمـوو ئەمانـەش بێگومـان بـۆ کەسـانی گـەورە واتـە (بالـغ) وە هەروەهـا ژیـرە (عاقـل) چونکـە مرۆڤـی منـداڵ و شـێت و خەوتـوو ئەرکــی شــەرعیان لەســەر نیــەو بــوراون لەلایــەن خــوای گــەورەوە تــا ئـەو باردودۆخـەی تێیدایـە لادەچێـت، وەك لـە فەرموودەیەکـدا هاتـووە

١ سورەتی الذاريان ئايەتی ٥٥
٢ بوخاری ڕیوایەتی کردووە

{عن النبي صلى الله عليه وسلم قال رفع القلم عن ثلاث عن النائم حتى يستيقظ وعن الصغير حتى يكبر وعن المجنون حتى يعقل أو يفيق}[3] وه ئەمەش پێوەرێکە بۆ هەموو کاریکێ تری شەرعی. جا مادام هەموو شەرتەکانمان تێدا بوو دەبێت هەستین بە جێ بەجێ کردنی. مانگی ڕەمەزان یەکێکە لە هەرە مانگە گرنگەکان، چونکە قورئانی پیرۆزی تێدا هاتۆتە خوارەوە وەك خوای گەورە دەفەرمووێ { شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ }[4] وە هەروەها شەوی پیرۆزو بەفەڕی تێدایە وەك بە القدر ناوبراوە تێیدا ئەو هەموو خێرو پاداشتە دەست دەکەوێت وەك دەفەرمووێ { لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ }[5] لەسەرمان فەرز دەبێت گرتنی ئەم مانگە لەیەکەم ڕۆژیەوە تا کۆتایی مانگەکە وەك خوای گەورە دەفەرمووێ { فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ }[6] گرتنی ڕۆژوو کە بە صوم ناوبراوە واتە خۆگرتنەوە دەکرێت خۆگرتنەوە چەندەها جۆری هەبێت بەڵام لێرەدا بە واتایی خۆگرتنەوە لە: خواردن و خواردنەوەو جیماع دێت لەگەڵ هەبوونی نیەتدا[7]. جێگەی نیەتیش دڵە لەبەر ئەوە گرنگ نیە ئەگەر بەدەم نەوتراو نابێت بکرێتە بیانوی ڕۆژوو شکاندن مادام لە دڵدا نیەتەکە هەبوو بێت. پێویستە لەسەرمان هەر لە

٣ ابی داود ڕیوایەتی کردووە
٤ سورەتی البقرة ئایەتی ١٨٥
٥ سورەتی القدر ئایەتی ٣
٦ سورەتی البقرة ئایەتی ١٨٥
٧ بڕوانە كفاية الاخيار لاپەڕە ٢٣٨

ئێسـتاوە ئامـادەكاری بكەیـن بـۆ بەدەمـەوە چوونـی ئـەم مانگـە پیـرۆزە بەشـێوەیكی ڕێـك و پێـك و تـەواوی وە دوعـاش بكەیـن نەمریـن مـادام ئـەم مانگـە نزیـك بووەتـەوە تـا لـە خێـری ئـەم مانگە بێ بـەش نەبیـن و بە خۆداچوونەوەیەكـی خۆمانـی تێـدا بكەیـن و نیەتمـان پـاك بكەینـەوەو تەوەبـەی تێـدا بكەیـن لـە هـەر تـاوان و كەمتەرخەمیـەك كـە كردبێتـمان لـە ڕابـووردودا. پەیـمان بدەیـن جارێكـی تـر نەگەڕێینـەوە سـەری و وە بـە هێزێكـی پـڕ بـاوەڕو ئەوپـەڕی تواناماـنەوە بەڵێـن بدەینـە خـوای گـەورە كـە كار بـۆ ئیسـلام بكەیـن و هەمـوو هەوڵـمان بـەردەوام لەگـەڕدا بێـت بـۆ بەدەسـتهێنانی ڕەزامەنـدی اللـە، كارەكانمـان لـەو چوارچێـوەدا بێـت كـە ئـەو داینـاوە، بـە ئومێـدی ڕەزامەنـدی خـوای گـەورە، چونكـە ڕەزامەنـدی ئـەوە دەتوانێـت خۆشـبەختمان بـكات لـە دونیـاو دواڕۆژدا.

# ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان

[8]{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تتقون}

مانگی ڕەمەزان مانگی لێخۆشبوون و بەخۆداچوونەوەو تەوبەکردن و چاکە کردنە، مانگێکی پیرۆزەو گەورەترین کار تێیدا ڕوویداوە کە ئەویش هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆزە، ئەو قورئانەی کە خوای گەورە کردی بە دواهەمین کتێب بۆ هەموو مرۆڤایەتی تا ڕۆژی دوایی، ئەو قورئانەی کە مایەی دڵخۆشی و شانازی هەموو مسوڵمانێکەو هۆی ڕێنموونی و تەحەدای هەموو لایەکە. ئەو مانگی ڕەمەزانەی کە هەموو مسوڵمانان بەیەك دەنگ و بەیەك جۆر تێیدا بەڕۆژوو دەبن لە سەرانسەری جیهاندا. باسکردن لە پیرۆزی و تایبەتمەندیەکانی ئەم مانگە زۆرن لێرەدا بەجێی دەهێڵین و دەڕۆینە ناو چۆنێتی ڕۆژوو گرتنەوەو ئەو کارانەی کە پەیوەندیان بەم کردارە پیرۆزو بە بەرەکەتەوە هەیە.

# تایبەتمەندی ڕۆژوو

ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان وەك هەر کردارێکی تری ئاینی کۆمەڵێك تایبەتمەندی خۆی هەیە. هەموو مسوڵمانێك پێویستە لەسەری کە بەرچاو ڕوونیەکی لەسەر ئەم مانگەو وە چۆنێتی ڕۆژوو گرتن

8 سورەتی البقرة ئایەتی ١٨٣

هەبێت بۆ ئەوەی کارەکانی بە پێی ئەوە بێت کە خوای گەورە داوای کردووە. ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیسلام وەك لە فەرموودەی ( بنی الاسلام علی خمس )[9] دا هاتووە وە باسی ڕۆژووشی تێدا کردووە. وە کۆمەڵی زانایانیش هاوڕان لەسەر واجبێتی گرتنی ئەم مانگە[10].

# ڕۆژوو

ڕۆژوو لە زمانەوانیدا واتە: خۆ گرتنەوە وەك خوای گەورە دەفەرمووی لەباسی مەریەمدا سەلامی خوای لێ بێت {انی نذرت للرحمن صوما}[11] بەڵام ڕۆژوو گرتنەکەی مەریەم سەلامی خوای لێ بێت بە قسە نەکردن بوو، لێرەدا مەبەست ووشەی (صوم) کە بەواتای لە خۆ گرتنەوە دێت لە شەرعدا یانی لە خۆ گرتنەوەیەکی تایبەت لە کەسێکی تایبەت لە کاتێکی تایبەتدا بە مەرج. وەڕۆژوو واجب بووە بە پێی قورئان وفەرموودەو کۆڕەوی زانایان، وە کاتەکەشی بە بینینی مانگە لە ڕەمەزاندا وەك دەفەرمووێ {فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ} [12]

٩ بوخاری ڕیوایەتی کردووە
١٠ بڕوانە کفایة الاخیار لاپەڕە ٢٣٨
١١ سورەتی مریم ئایەتی ٢٦
١٢ سورەتی البقرة ئایەتی ١٨٥

# مەرجەکانی واجب بوونی ڕۆژوو

سێ مەرج هەیە بۆ واجب بوونی ڕۆژوو:

١- ئیسلام واتە بێ باوەڕ ڕۆژووی لەسەر واجب نیە ئەمە کارێکە پەیوەندی بە مسوڵمانەوە هەیە ئەگەر بێ باوەڕ ڕۆژووش بگرێت بۆی حسێب ناکرێت وە هیچ پاداشتێکی لەسەر وەرناگرێت، چونکە مسوڵمان کە ڕۆژوو دەگرێت لەبەر خوا دەیگرێت، بەڵام بێ باوەڕ لەبەر چ! ئەگەر بیشی گرێت بۆ مەرامێکی دونیایە وەك خۆ لاواز کردن، یان هەر هۆکارێکی تری دونیایی کە لە تەرازووی خوای گەورەدا هیچ قورسیەکی نی یە.

٢- گەورە (بالغ) واتە لەسەر منداڵ واجب نیە ئەمەش مانای وانی یە منداڵ بۆی نیە بیگرێت وەیان پاداشتی لەسەر وەرناگرێت بێگومان نەخێر، باشتر وایە منداڵانیش لەسەر ئەم کردارە پیرۆزە ڕابهێنرێت بۆ ئەوەی کە گەورە بوو لەسەری ئاسان بێت، هەروەها خوای گەورە بۆشی حسێب دەکات وەهەموو کردەوەیەکی چاکی تر مادام لەبەر خوای گەورەو بۆ ڕاهێنان بێت لەسەر چاکەکاری، وە خەیری ئەوەش دەگات کە ئەو ڕاهێنانەی پێ دەکات، دەبێت ئەوەمان لەبیر بێت زۆر جار زۆرکەس بەهەڵەدا دەچن لەسەر ئەم خاڵە واتە بالغ بوون، بالغ بوونی شەرعی ئەوەیە ئەگەر ئافرەت بوو سەرەتای کەوتنە حەیزەوەیە وە پیاویش ئیحتیلام بوون، ئیتر هەر شتێکی تر کە بۆ منداڵ بوون دیاری کراوە لەهەر قانون و دین و کەلتورێکی تردا پێوەر نیە بۆ ئەم کارە، بۆ نمونە لە ئەوروپادا تا

تەمەنـی ١٨ سـاڵ هـەر بـە منـداڵ دادەنرێـت وە دەکرێـت لەتەمەنـی ١٨ سـاڵیدا چ کـچ وە کـوڕ چەنـد سـاڵێك بەسـەر بالـغ بوونیـدا تێپـەڕ بـوو بێـت.

٣- ژیـری (العقـل) ژیـری پێویسـتە هەبێـت بـۆ ئـەوەی بزانێـت چ دەکات، شـێت هیـچ تەکلیفێکـی شـەرعی لەسـەر نیـە وەك پێغەمبـەر درودی خـوای لـێ بێـت دەفەرمـووێ {عـن النبـي صـلی اللـه علیـه وسـلم قـال رفـع القلـم عـن ثـلاث عـن النائـم حتـی یسـتیقظ وعـن الصغـیر حتـی یکـبر وعـن المجنـون حتـی یعقـل أو یفیـق}[١٣] لـە پێغەمبـەرەوە درودی خــوای لــێ بێــت هاتــووە، دەفەرمــووێ قەڵەمــی تــاوان لەســەر ســێ کۆمـەڵ لابـراوە خەوتـوو تـا هەڵدەسـتێت، منـداڵ تـا گـەورە دەبێـت، شـێت تـا ژیـر دەبێـت یـان چـاك دەبێتـەوە. کەواتـە کەسـێك ڕۆژووی لەسـەر واجبـە کـە مسـوڵمان و گـەورەو ژیـر بێـت.

# فـەرزەکـانـی ڕۆژوو

فەرزەکانی ڕۆژوو پێنجن:

١- نیـەت هێنانـە، نیـەت هێنانیـش تەنهـا دڵ بەسـە بـۆ کردنـی ئـەم کارە وە جێگـەی ڕاسـتەقینەی نیـەت دڵـە، زۆر بەداخـەوە هێشـتا زۆر کـەس ناتوانێـت ئەمـە هـەزم بـکات و هـەر نکۆڵـی لێـدەکات و وە زۆر پێداگـرە لەسـەر ووتنـی بـەدەم، لێـرەدا ئێمـە قسـەمان لەسـەر ئـەوە نیـە کـە ووتنـی بـەدەم ڕەوا نیـە، بەڵکـو ئاسـاییە بـەڵام ئەگـەر بـە ووتـەش نەوتـرا

١٣ ابی داود ڕیوایەتی کردووە

زۆر ئاسایيه مادام نیەتەکە هەبوو بێت لە دڵدا. هەر کردارێك کە دەکرێت بێ گومان خوای گەورە ئاگادارە بە نیەتەکەت خۆ ئەگەر بە ووتە بڵێی خوایە من بەیانی بەڕۆژوو دەبم لەبەر تۆ بەڵام لە دڵتا ئەوەت مەبەست نەبوو بێگومان خوای گەورە سەیری دڵ دەکات، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا هاتووە کە خوای گەورە نە سەیری جەستە نە شێوەو ڕوخسارمان دەکات بەڵکو سەیری دڵ و کردەوەمان دەکات، وە دڵ گرنگیەکی ئەوتۆی هەیە لە شەرعدا، جا دەبێت نیەتمان هەبێت بۆ کردنی ئەم کارە لە کاتی خۆیدا ئەویش پێش سبەینانە وە دەکرێت هەر لەسەرەتایی مانگەوە نیەتمان هەبێت بۆ کردنی ئەم کارە پیرۆزە ئەویش هەر بە بوونی ئەو کارە لە دڵماندا.

٢- خۆ گرتنەوە لە خواردن و ٣- خواردنەوە، نابێت بە هیچ شێوەیەك خواردن و خواردنەوە لە ڕۆژی ڕەمەزاندا بخورێت بە خواردنی یان خواردنەوەی هەر شتێك ئەگەر کەم وەیان بچوکیش بێت ڕۆژووەکەی پێ دەشکێت و دروست نابێت مەگەر لەبیری نەبێت کە بە ڕۆژووە، جا ئەگەر لە بیری نەبوو وە شتێکی خوارد زیان بە ڕۆژووەکەی ناگات چونکە ویستی ئەوە نەبووە ڕۆژووەکەی بشکێنێ، وەك لە فەرموودەیەکدا هاتووە {من نسی وهو صائم فاكل أو شرب فليتم صومه فانما أطعمه الله وسقاه} [14] واتە ئەگەر یەکێك لە بیری چوو کە بەڕۆژووە شتی خوارد وەیان خواردیەوە با بەردەوام بێت لەسەر ڕۆژووەکەی ئەوە خوای گەورە خواردن یان خواردنەوەی

١٤ بوخاری ڕیوایەتی کردووە

پێـداوە. بەڕاسـتی ئەمـە واقعێتـی ئیسـلام جێگیـر دەکات. ئەگـەر شـتیك کـە دەسـتەڵاتی تیـا نەبێـت ڕۆژوو ناشـکێنی وەك دوکەڵـی کارگـەو تەپوتـۆزو ئـەو شـتانە، بـەڵام دوکەڵـی جگـەرەی جگەرەکێـش ڕۆژووەکـەی دەشـکێنی چونکـە بـە ئـارەزووی خـۆی بـووە نـەك ناچـاری.

٤- کاری جـووت بـوون (الجماع) ڕۆژانـی ڕەمـەزان کاتـی خـوا پەرسـتیەو نابێـت کاری جـووت بونـی تێـدا ئەنجـام بدرێـت، وە ئەگـەر ئـەو کارە کـرا ڕۆژووەکـە دەشـکێ و وە کافەرەتیشـی دەکەوێتەسـەر ئەویـش ئـازاد کردنـی بەندەیەکـە، گـەر نەبـوو دوومانـگ لەسـەر یـەك بـە ڕۆژوو بوونـە، ئەگـەر نەتوانـرا دانـی خواردنـە بـە ٦٠ هـەژارو کـەم دەرامـەت. وە هـەر کارێکـی تـر بـۆ خـۆ ڕەحـەت کـردن بـۆ نمونـە بەدەسـت ..تـاد ڕۆژوەکـە دەشـکێنێ. وە ئەگـەر لـە بیـرت چـوو کـە بـە ڕۆژووی هەمـان حوکمـی خـواردن و خواردنـەوەی هەیـە واتـە ناشـکی خـوای گـەورە زاناتـرە[١٥].

٥- خـۆ ڕشـانەوە بـە زۆر دەبێـت ئـاگاداری لـێ بکرێـت و بـەزۆر خـۆت نەڕشـێنیتەوە. وە هەروەهـا زانینـی ڕۆژ چ لـە سـەرەتاوە وەیـان لـە کۆتاییـەوە، دەبێـت ئـاگاداری ئـەوە بکرێـت کـە خـۆت بگریتـەوە لـە هەمـوو ئـەو شـتانە پێـش ڕۆژ هەڵاتـن تـا ڕۆژئـاوا بـوون خـۆ ئەگـەر بەکەمێکیـش بێـت ڕۆژووەکـە دروسـت نابێـت یانـی بـە هەڵاتنـی ڕۆژ وەیـان بـە ئـاوا نەبوونـی.

---

١٥ بڕوانە كفاية الاخيار لاپەڕە ٢٤٠

# ئەو شتانەی کە ڕۆژوو دەشکێنن

ئەوشتانەی کە ڕۆژوو دەشکێنن ١١ شتن:

١-هەرشتێك بە ئەنقەستی بگاتە بۆشایی زگی مرۆڤ واتە مەعیدەی.

٢-هەرشتێك بە ئەنقەست بڕواتە ناو بۆشایی سەر وەك لووت و گوێ.

٣-شت خستنە ناو بۆشایی دواوە یان پێشەوە، وەك دەرمان و ئەو جۆرە شتانە، وە هەروەها پەنجە تێنانیش دەگرێتەوە.

٤-خۆ ڕشانەوە بە ئەنقەست، بەڵام ئەگەر بۆخۆی ڕشایەوە ناشکێ.

٥-کاری جووت بوون.

٦-خۆ ڕەحەت کردن چ خۆی بۆ خۆی بێت یان کەسێکی تر بێت.

٧-خوێنی حەیز ئافرەت، واتە سوڕی مانگانە.

٨-خوێنی نیفاس ئەو خوێنەی دوایی منداڵ بوون دێت.

٩-شێت بوون، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت.

١٠-هەڵگەڕانەوە لە دین خوا پەنامان بدات)).[١٦]

١١- نیەت گۆڕین، وەك یەکێ بڵێ ڕۆژوەکەم دەشکێنم یان پاش کەمێکی تر دەیشکێنم یان با بزانم چۆن دەبێت. لەم جۆرە قسانە وە هۆی شکاندنی بە نیەتگۆڕین با هیچیشی نەخواردبێ هەر دەشکێ. جا دەبێت متمانەی تەواو ببێت بە خۆو ئەو جۆرە دوودڵیانە دروست نەکات لە خۆیدا، تا هەر لەسەر یەقین بێت.

١٦ هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٢٤١

# هەندێك ئادابی باش دەربارەی ڕۆژوو لەڕەمەزاندا

کارێکی باشە ڕۆژووەوان ئاگای لەم ڕەوشتانە بێت لە ڕۆژوودا
١-پارشێوکردن، کارێکی باشەو بکرێت، بەڵام تاوانی نیە ئەگەر نەشکرێت، کردنی باشەو سونەتی پێغەمبەرە وەك دەفەرمووێ {تسحروا فاءن السحور برکة}[17] واتە پارشێو بکەن چونکە بەرەکەتی تیایە وە هۆی بەرەکەتەکەشی ئەوەیە ڕۆژووەوان بەهێز دەکات))[18]
٢-پەلەکردن لە ڕۆژوو شکاندندا هەرکە دڵنیا بوویت کە ڕۆژ ئاوا بووە، وە هەروەها هەوڵ بدرێت کە بە چەند دەنکە خورمایەکی تەڕ ڕۆژووەکە بشکێنرێت، وەگەر نەبوو بە ئاو.
٣-دوعاو پاڕانەوە لەکاتی بەربانگدا پێغەمبەر درودی خوای لێ بێت دەفەرمووێ {ثلاثة لاترد دعوتهم الصائم حتی یفطر، والامام العادل، والمظلوم}[19] واتە سێ کەس یان کۆمەڵ خوای گەورە داواکانیان ناگەڕێنێتەوە، یەکەمیان ڕۆژووەوان، دووەمیان سەرۆکێکی عادل وە سێهەمیان کەسێکی ستەم لێکراو.
٤-خۆگرتنەوە لە هەموو شتێکی پڕو پوچ وەك زەمی خەڵك کردن و باسی ئەم وئەو، کات کوشتن بەشتی بێ بەهاوە، چونکە ئەم مانگە مانگێکە فرسەتێکی زێڕینە بۆ عیبادەت کردن و کۆکردنەوەی زەخیرە بۆ دواڕۆژ وە هەرکارێك لەم ڕۆژانەدا دەکرێت بێگومان خێری

---

١٧ بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە
١٨ بڕوانە فقه السنة السید سابق ج١ لاپەڕە٤١٩
١٩ هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٤٢١

زیاتـره لـه لـه ڕۆژانـی تـر. پێغەمبـەر درودی خـوای لـێ بێـت دەفەرمـووێ {رب صائـم لیـس لـه مـن صیامـه الا الجـوع}[20] واتـە ڕۆژووەوانـی وا هەیـە جگـە لـە برسـێتی هیچـی بـۆ نامێنێتـەوە.

٥- سـیواك کردن٦-قورئـان خوێنـدن، و ئامادەبوونـی کـۆڕی زیکـرو یادکردنـی خـوا، خـۆ مەشـغوڵ کـردن بـە تێگەیشـتنمان لە ئیسـلام زیاتر، وە ئێسـتە بـە هـۆی ئـەم تەکنەلۆجیـای لـە بەردەسـتماندایە دەتوانیـن زیاتـر سـودمەندبین ئـەو هەمـوو سـایتە هەیـە کـە کاری ئیسـلامی بـڵاو دەکاتـەوە سـایتی واهەیـە بـە هەزارەهـا ووتـارو دەرسـی تێدایـە جگـە لـەو هەمـوو کتێـب و وتارانـەی کـە بـەردەوام دادەبـەزن و ئالاتـی تـری وەك سـیدی و کەناڵـی ئیسـلامی جیـاوازو هەتـا موبایلەکانیشـمان.

٧-هەوڵدانـی زیاتـر لـە دە ڕۆژی کۆتایـی مانگـی ڕەمەزانـدا کـە شـەوی بـە فەریشـی تـێ دەکەویـت (القـدر) پێغەمبـەر درودی خـوای لـێ بێـت خـۆی گرنگیەکـی زۆری بـەم ڕۆژانـە داوە لەگـەڵ عائیلەکانیـدا وەك دەفەرمـووێ {کان اذا دخـل العـشر الاواخـر احـي الليـل، وايقـظ اهلـه، وشـد المئـزر}[21]

٢٠ النسائي و ابن ماجه و الحاكم ڕیوایەتیان کردووە وە حەدیسێکی سەحیحە لەسەر ئەو شەرتانەی کە ئیمانی بخای دایناوە

٢١ بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە لە دایکە عائیشەوە

# ئەو ڕۆژانەی کە ڕۆژووی تێدا دروست نی یە

پێنج ڕۆژ هەن کە دروست نیە ڕۆژوویان تێدا بگیرێت هەردوو جەژنەکەو وە سێ ڕۆژی دوایی جەژنی قوربان، وە ڕۆژووی بە گومانیش دروست نیە کە بە یەومولشك ناسراوە، ئەوەیە کە ڕوون نیە ئایە ڕەمەزانە یان نە، تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبیت کە خویان گرتووە بەڕۆژووەوە وە ئەو ڕۆژەش دەکەوێتە ئەو کاتەی کە خوی پێوە گیراوە بۆ نمونە کەسێك عادەتی وایە هەموو ڕۆژی دووشەممەو پێنج شەممەیەك بە ڕۆژوو بێت وە ڕۆژی یەومولشکیش بکەوێتە دووشەممە یان پێنج شەممەوە، دەبێت ئەوەش بزانین کە ئەو کەسەی وەك خو کە سونەتە ئەم ڕۆژە دەگرێت نیەتی ڕەمەزانی لێ ناهێنێ.

# کێ دەتوانێت بەڕۆژوو نەبێت

ئەوکەسانەی کە لە سەفەردان سەفەرێکی دوورو درێژ بۆیان هەیە بۆ ڕۆژوو نەبن وە کاتێکی تر بیگرنەوە چونکە دین ئاسانەو ئاسانکاری پێخۆشە لە پێناو خۆشگوزەرانی مرۆڤەکاندا، کەسێك کە نەخۆش بێت چونکە یەکێك لە هۆکارەکانی هاتنی ئاینی ئیسلام بۆ پاراستنی مرۆڤەکانە هەرکات ئەو جەستە کەوتەوە مەترسیەوە شەرع ڕێگەی داوە بە دواخستنی ڕۆژوو داوە تا کاتێك چاك دەبێتەوە، کەسێك کە زۆر پیر بووەو توانی ڕۆژووی نەماوە دەتوانێت

بـۆ هــەر ڕۆژێــك كەفارەتەكــەی دەدات، ئەوكەســانەی كــە دووگیانــن وەیـان شـیر دەرن دەتوانـن بـەڕۆژوو نەبـن لـە دواتـر بیگرنـەوە، لێـرەدا جیاوازیـەك هەیـە لـەوەی ئەگـەر ئافرەتەكـە لـە خـۆی ترسـا لـە ڕۆژوو شــكاندنەكەی تەنهــا ڕۆژووەكــە دەگرێتــەوە وەئەگــەر لــە منداڵەكــەی ترسـا ئەوكاتـە ڕۆژوو وەهــەم كەفارەتیشــی دەكەوێتـە ســەر»[22]

تەنهـا ئـەم فەرمـوودە بەسـە بـۆ دڵخۆشـیمان بـە گرتنـی مانگـی ڕەمــەزان و گرتنــی شــەوی قــەدر

{عــن النبــي صــلى اللــه عليــه وســلم قــال مــن قــام ليلــة القــدر إيمانـا واحتسـابا غفـر لـه مـا تقـدم مـن ذنبـه ومـن صـام رمضـان إيمانـا واحتسـابا غفـر لـه مـا تقـدم مـن ذنبـه}[23] ئـەوەی شـەوی قـەدر بكاتـەوە بـە عیبـادەت خـوای گـەورە لـە هەمـوو گوناهەكانـی ڕابـووردووی خـۆش دەبێــت وەهەروەهــا ڕۆژووی مانگــی ڕەمەزانیــش.

دەبێـت ئـەوە بزانیـن كـە چـواردە جـۆر ڕۆژوومـان هەیـە هەشـتیان لـە قورئانــدا بــاس كــراوە وە شەشیشــیان لــە ســونەتدا»[24]، ئێمــە تەنهــا باســی ڕۆژووی مانگــی ڕەمەزانمــان كــرد.

---

٢٢ بڕوانە كفاية الاخيار لاپەڕە ٢٤٧

٢٣ بوخاری ڕیوایەتی كردووە

٢٤ بڕوانە تحفة الفقهاء لعلاء الدين السمرقندي ج١ لاپەڕە٣٤١

# هەوڵێکی کەم پاداشتێکی زۆر (شەوانی قەدر)

بێگومـان کـەس نیـە لـە ئێمـە کـە تاوانـی نەکردبێـت و پێویسـتمان بـە بەزەیـی و لێخۆشـبون و پاداشـتی خـوای گـەورە نەبێـت. شـەوی قـەدر کـە لـە کۆتایـی مانگـی ڕەمەزاندایـە ئـەو هەمـوو خێـرەی تێـدا دەسـت دەکەوێـت بەڕاسـتی هەلـەو گرنگـە ئـەم هەلـە بقۆزینـەوە بـۆ بەدەسـتهێنانی ئـەو پاداشـتە گەورەیـە، بـە ئومێـدی دەسـت کەوتنـی ئـەو پاداشـتە گەورەیـەو لێخۆشـبونی تاوانەکانمـان زۆر پێویسـتمان بـەم جـۆرە هەلانـە دەبێـت و زۆر گرنگـە کـە نەهێڵیـن لەدەسـتمان دەربچێـت. بـۆ تێگەشـتن لـە شـەوی قـەدر کـە سـورەتێکی قورئانـی بەناوەوەیـە پێـمان خۆشـە بچینـە خزمەتـی ئـەو سـورەتەو لێکدانـەوەی ئـەو شـەوە چونکـە قسـەی زۆر هەیـە لەسـەر ئـەم شـەوە چ شـەوێکە؟ چونکـە بەشـێوەیەکی گشـتی مسـوڵمانان نایانەوێـت ئـەم شـەوەیان لەدەسـت بچـێ وەلەهەمـان کاتـدا دەیانەوێـت هـەر یـەك شـەو دانیشـن و ئـەو پاداشـتە گەورەیـان دەسـت بکەوێـت یانـی بەکەمتریـن کات زۆرتریـن پاداشـتیان دەسـت بکەوێـت!.

یەکـەم ئایەتـی سـورەتی قـەدر دوای بسـم اللـە الرحمـن الرحیـم { إِنَّـا أَنْزَلْنَـاهُ فِي لَيْلَـةِ الْقَـدْرِ } واتـە ئێمـە قورئانمـان دابەزاندووەتـە خـوارەوە لـە شـەوی بـە فـەڕدا لـە تەفسـیری الجلالیـن دا هاتـووەو دەڵـێ: لـەم شـەوەدا هەمـوو قورئـان بـە یەکجـار لـە اللـوح المحفوظـەوە دابەزیـوە بـۆ ئاسـمانی دونیـا. کۆمەڵێـك ئایـەت و فەرمـوودە لەبـارەی دابەزینـی قورئانـەوە ئەدوێـن کورتەکـەی ئەوەیـە کـە قورئـان لەشـەوی قـەدردا لـە

مانگـی ڕەمەزانـدا هاتۆتـە ئاسـمانی دونیـا وە دواتـر بـە گوێـرەی پێویسـت و هـۆکارەکان لـە مـاوەی بیسـت و سـێ سـاڵدا هەمـووی دابەزیـووە بـۆ سـەر پێغەمبەرمـان درودو سـڵاوی خـوای لـێ بێـت. دوا بـەدوای ئـەوە دەفەرمـوێ {وَمَـا أَدْرَاكَ مَـا لَيْلَـةُ الْقَـدْرِ} ئـەم ئایەتـەش ڕونکەرەوەیەکـە بـۆ ئایەتەکـەی پێشـوو، وە هـەر خـوای گـەورە خـۆی دەفەرمـووێ کـە ئـەو شـەوە بەفـەڕە چـی یـە ڕوونـی دەکاتـەوە بـۆ پێغەمبـەر وە لـە پێغەمبـەرەوە بـۆ دوای خـۆی هەروەهـا. هـۆی ناوهێنانـی ئـەم شـەوە بـە قـەدر ئەوەیـە وەك لـە تەفسـیری القرطبـی دا هاتـووە لـەم شـەوەدا خـوای گـەورە ئەنـدازەی سـاڵی داهاتـوو دەکێشـێ لـە دانـی ڕزق و ڕۆزی و مـردن و ئەجـەل. لێـرەدا دێتـە سـەر باسـکردنی ئـەم شـەوە پیـرۆزە وەك دەفەرمـوێ {لَيْلَـةُ الْقَـدْرِ خَـيْرٌ مِـنْ أَلْـفِ شَـهْرٍ} شـەوی قـەدر چاکـترە لـە هـەزار مانـگ، مەبەسـت چاکـترە لـە هـەزار مانـگ خیـرو پاداشـتەکەیەتی ئـەو کارو کـردەوە خێرانـەی کـە لـەم شـەوە بەفـەڕەدا دەکریـت چاکـترە لـە هـەزار مانـگ. لـە ڕاڤـەی ئـەم ئایەتـەدا لـە تەفسـیری ابـن کثیـردا هاتـووە (أَنَّ النَّبِـيّ صَـلَّى اللَّـه عَلَيْـه وَسَـلَّمَ ذَكَـرَ رَجُـلًا مِـنْ بَنِـي إِسْرَائِيـل لَبِـسَ السِّـلَاح فِي سَـبِيل اللَّـه أَلْـف شَـهْر قَـالَ فَعَجِـبَ الْمُسْـلِمُونَ مِـنْ ذَلِـكَ قَـالَ فَأَنْـزَلَ اللَّـهُ عَـزَّ وَجَـلَّ « إِنَّـا أَنْزَلْنَـاهُ فِي لَيْلَـةِ الْقَـدْرِ وَمَـا أَدْرَاكَ مَـا لَيْلَـةُ الْقَـدْرِ لَيْلَـةُ الْقَـدْرِ خَـيْرٌ مِـنْ أَلْـف شَـهْر » الَّتِـي لَبِـسَ ذَلِـكَ الرَّجُـل السِّـلَاح فِي سَـبِيل اللَّـه أَلْـف شَـهْر . وَقَـالَ ابْـن جَرِيـر حَدَّثَنَـا ابْـن حُمَيْـد حَدَّثَنَـا حَـكَّام بْـن مُسْـلِم عَـنْ الْمُثَنَّـى بْـن الصَّبَّـاحَ عَـنْ مُجَاهِـد قَـالَ كَانَ فِي بَنِـي إِسْرَائِيـل رَجُـل يَقُـوم اللَّيْـل حَتَّـى يُصْبِـح ثُـمَّ يُجَاهِـد الْعَـدُوّ بِالنَّهَـارِ حَتَّـى يُمْسِـي فَفَعَـلَ ذَلِـكَ أَلْـف شَـهْر

فَأَنْـزَلَ اللَّـه هَـذه الْآيَـة» لَيْلَـة الْقَـدْر خَـيْر مِـنْ أَلْـف شَـهْر « قِيَـام تِلْـكَ اللَّيْلَـة خَـيْر مِـنْ عَمَـل ذَلِـكَ الرَّجُـل) پیاوێـك هەبـوو لـە بەنـی ئیسـلائیل کـە هـەزار مانـگ چەکـی لەخـۆ کردبـوو لـە پێنـاوی خـوادا دەجەنـگا وە مسـوڵمانەکان زۆر سەرسـامی ئـەم کابـرا بـوون یانـی وەك بڵێـی چ پاداشـتێکی هەبێـت ئـەم هـەوڵ و تێکۆشـانە و وەچـۆن ئـەو پاداشـتە دەسـت بکەوێـت. خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد کـە زینـدوو کردنـەوەی ئـەم شـەوە بـۆ پەرسـتش لـە پێنـاو خـوادا ئـەو پاداشـتەی دەبیـت {تَنَـزَّلُ الْمَلَائِكَـةُ وَالـرُّوحُ فِيهَـا بِـإِذْنِ رَبِّهِـمْ مِـنْ كُلِّ أَمْـر} هـۆی گرنگـی ئـەم شـەوە لـەم ئایەتـەدا دەردەکەوێـت کـە فریشـتەی تێـدا دادەبەزێـت بـە ئیزنـی خـوا کـە بڕیـاری هەمـوو شـتێکی ئـەو سـاڵی داهاتـووی پـێ یـە لـە مـردن و ژیـان و ڕزق و ڕۆزی وەك لـە ئایەتـی دووهەمـدا ئاماژەمـان پـێ کـرد، کۆتـای ئایەتەکـە دەفەرمـوێ {سَـلَامٌ هِـيَ حَتَّـى مَطْلَـعِ الْفَجْـر} ئارامـی و خۆشـی تـا بەرەبەیـان.

لەڕاسـتی دا لـە زۆر لـە سـەرچاوەکان ئامـاژە بـۆ شـەوانیك هەیـە وەك شـەوی بیسـت و حـەوت و تاکـەکان، بـەڵام گرنگتریـن و باشـترین ئەوەیە کـە لـە دە شـەوی کۆتـای ڕەمەزاندایـە ئـەم دوو فەرمـوودەی خـوارەوە بـە نمونە.

(کان رسـول اللـه صـلى اللـه عليـه وسـلم يعتكـف العـشر الأواخـر مـن رمضـان) واتـە پیغەمبـەر درودی خـوای لـێ بێـت دە شـەوی کۆتایـی ڕەمـەزان لـە مزگـەوت دەمـاوە.

(أن النبـي صـلى اللـه عليـه وسـلم كان يعتكـف العـشر الأواخـر مـن رمضـان حتـى توفـاه اللـه ثـم اعتكـف أزواجـه مـن بعـده) هەمـان مانـای

فەرموودەکـەی تـری هەیـە وە خێزانەکانیشـی دوای ئـەو هـەر بـەو شـێوەیان کـردووە. جـا بـۆ بەدەسـت خسـتنی ئـەو خیـرو پاداشـتە گەورەیـە گرنگـە ئـەو شـەوانە بـە عیبـادەت بکەینـەوە بـۆ مسـۆگەری کردنـی ئـەو خیـرە گەورەیـە، گـەر دە شـەوی کۆتایـی ڕەمەزانمـان کـردەوە زیاتـر لەوەمـان دەسـت دەکەوێـت هـەم خێـری قەدرەکـەو وە هـەم عیبـادەت کردنەکانمـان لـە شـەوەکانی تـری غەیـری قـەدردا. گرنگـی قـەدر بەهـۆی دابەزاندنـی قورئانەوەیـە کـە گرنگـە مرۆڤـەکان بـە ئاگابـن لەهـۆکاری دابەزاندنـی و چۆنیەتـی دابەزاندنـی.

## دابەزینی قورئانی پیرۆز

خـوای پـەروەردگار قورئانـی پیـرۆزی بـۆ سـەر پێغەمبـەر درودو سـەلامی خـوای لـێ بـێ دابەزانـدووە بـۆ ڕێنموونـی کردنـی هەمـوو مرۆڤایەتـی ... شـێوەی ئـەو دابەزینـەش بـە دوو جـۆر بـووە:

یەکەم: دابەزاندنی هەموو قورئان لە بیت العزەوە بۆ ئاسمانی دنیا.

دووەم: دابەزاندنـی لـە ئاسـمانی دنیـاوە بـۆ پێغەمبـەر درودو سـەلامی خـوای لـێ بێـت، کـە بەشـێوەی بـەش بـەش و لـە مـاوەی ٢٣ سـاڵدا بـووە، واتـە بـە پێچەوانـەی کتێبـە ئاسـمانیەکانی تـر. هەمـوو کتێبـە ئاسـمانییەکان سـەرچاوەیان یەکـە، لـە بیروبـاوەڕدا (العقیـدە)دا یەکباسـن، بـەڵام لـە یاسـاو ڕێسـایان (تەشریعـات) دا جیـاوازن.

# دابەزینی قورئانی پیرۆز بەیەکجار

خـوای پـەروەردگار ئەفەرمـوێ : (شـهر رمضـان الـذی انـزل فیـه القـرآن هـدی للنـاس وبینـات مـن الهـدی ولفرقـان) البقـره /١٨٤ واتـە مانگـی ڕەمـەزان (ئـەو مانگەیـە) کـە قورئانـی تیـادا هاتۆتـە خـوارەوە، لـە کاتێـکدا ئـەم قورئانـە ڕێنموونـی بەخشـە بـە خەڵکـی و بەڵگـەی زۆری تێدایـە. هەروەهـا: (انـا انزلنـاه فـی لیلـة القـدر) القـدر/١ واتـە ئێمـە بەڕاسـتی قورئانمـان دابەزاندۆتـە خـوارەوە لـە شـەوێکی بـە فـەڕو ڕێـزداردا. هەروەها: (انـا انزلنـاه فـی لیلـة مبارکة) الدخـان/٣ واتـە بەڕاسـتی ئێمـە لـە شـەوێکی بـە فـەڕو پیـرۆزدا (کـە شـەوی قـەدرە) دامانبەزاندووەتـە خوارەوە.ئـەم سـێ مانایـەش جیاوازیـان نییـە، هەمـوو هـەر باسـی دابەزینەکانـی قورئـان ئەکـەن ، شـەوی قـەدرو شـەوە پیرۆزەکـە هەریەکـن، ئیبنـو عەبـاس و هەندێکـی تـر لـە ئەسـحاب و تابعیـن - خـوا لێیـان ڕازی بێـت - ئەفەرمـون: مەبەسـت لـە دابەزینـی قورئـان لـەو سـێ ئایەتـەدا ئـەو هاتنـە خوارەوەیەتـی لـە بیـت العـزەوە بـۆ ئاسـمانی دنیـا، کـە ئیـتر بـە پێـی ڕوداوو پێویسـتی زەمانـی پێغەمبـەر درودو سـەلامی خـوای لـێ بـێ دەهاتـە خـوارەوە، تەبـەری لـە ئیبنـو عەبباسـەوە ڕیوایـە تـی کـردووە کـە فەرموویەتـی : (انـزل القـران فـی لیلـة القـدر فـی شـهر رمضـان الـی سـماء الدنیـا جملـة واحـدة ثـم انـزل نجومـا) واتـە قورئـان لـە شـەوی قـەدردا هاتۆتـە خـوارەوە بـۆ ئاسـمانی دنیـا ئینجـا دواتـر بـەش بـەش دەهاتـە خـوارەوە.

## دابەزینی قورئانی پیرۆز بەشێوەی بەش بەش

خوای گەورە دەفەرموێ: (وانە لتنزیل رب العالمین. نزل الروح الامین. علی قلبك لتكون من المنذرین. بلسان عربی مبین) الشعراء/١٩٢-١٩٥ واتە بەڕاستی ئەم قورئانە لە لایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەکانەوە ڕەوانە کراوە. جوبرەئیلی ئەمین ( فریشتەی وەحی ) دایبەزاندووە. بۆ سەر دڵی تۆ ئەی محمد صلی اللە علیە وسلم تا بچێتە ڕیزی ئەو کەسانەوە کە خەڵکی بێدار دەکەنەوە لە خەوی غەفڵەت دایاندەچڵەکێنن. بە زمانی عەرەبی ڕوون و ئاشکرا. هەروەها: (تنزیل الکتاب من اللە العزیز الحکیم) الجاثیة/٢ واتە ئەم قورئانە لە لایەن خوای باڵا دەست و داناوە هاتووەتە خوارەوە. هەروەها ئەو ئایەتانەی تریش کە لەم بارەوە هەن، هەمووی باس لەوە دەکەن کە قورئان بە زمانی عەرەبی ڕەوان بە جوبرەئیلدا هاتۆتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر درودو سەلامی خوای لێ بێت .. بەڵام دابەزینی ئایەتەکان وەکو یەك نەبوون ، جاری وا هەبووە سورەتێك هەمووی هاتۆتە خوارەوە، جاری واش هەبووە ٥ ئایەت لە سورەتێك هاتۆتە خوارەوە، جاری واش هەبووە بە گوێرەی پێویست زیاتر یان کەمتر بووە .. بەڵام کتێبەکانی پێشتر هەمووی پێکەوە دەهاتنە خوارەوە.وە دابەزینی قورئان بەم شێوەیە سودی زۆری تیا بووە کە سودەکەشی قورئان ڕوونیکردووەتەوە بەم شێوەیە وەك دەفەرموێت (وقال الذین کفرول لولا نزل علیە القرآن جملة واحدة کذالك لنثبت بە فؤادك ورتلناە ترتیلا) الفرقان/٣٢ واتە کافرەکان (بیانوویەکی

تریان گرت و) وتیان: بۆ قورئان بە یەك كەڕەت بۆی ڕەوانە ناكرێت، بێگومان ئێمە هەر بەو شێوەیە ڕەوانەی دەكەین، تادڵی تۆ زیاتر دڵنیا بكەین، بەردەوام بە جوانی دایدەڕێژین و دەیگەیەنین.

## حیكمەتی دابەزینی قورئان بە شێوەی بەش بەش

١- بۆ دڵ قایم كردنی پێغەمبەر درودو سەلامی خوای لێ بێ وەكو خوای گەورە دەفەرموێ (لنثبت بە فؤادك) الفرقان/٣٢ واتە تادڵی تۆ زیاتر دڵنیا بكەین. ئەمەش لە ژیانی كۆمەڵكاری خەڵكیدا شتێكی هەست پێ كراوە، چونكە هەموو كۆمەڵێك هەوڵ دەدات بەردەوام هەر ماوەیەك جارێك كۆبوونەوە بە ئەندامەكانی بكات و شتی نوێیان بۆ باس بكات.

٢- بۆ بەربەرەكانێ و تەحەدا كردنی موعجیزەیەتی قورئان، چونكە قورئان بەردەوام ئەو داوای تەحەددایەی بۆ هاوەڵ دانەرو بێ باوەڕەكان تازە دەكردەوە پێی دەوتن: دە ئەگەر ڕاست دەكەن سورەتێك وەكو ئەوانەی قورئان بهێنن: (وان كنتم فی ریب مما نزلنا علی عبدنا فاتوا بسورة من مثله) البقرة/٢٣  واتە جا ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان لەم (قورئانە پیرۆزە) هەیە كە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محمد صلی الله علیە وسلم ئەگەر بۆتان دەكرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سورەتێكی وەك ئەو بهێنن.ئەمەش داواكاریەكی بەردەوام بوو نەك هەر بۆ ئەو زەمانە بۆ دواترو بۆ زەمانی ئێستاو بۆ دواتریش، تا ڕۆژی دوایی.

٣- بۆ ئاسان تێگەیشتن و لەبەر کردن و چەسپاندنی، چونکە ئەگەر هەموو ئایەتەکانی بەجارێك بهاتایەتە خوارەوە، تێگەیشتن و لەبەر کرندن و وەرگرتنی بۆ هەموو لایەکیان ئاسان نەدەبوون: (هو الذی بعث فی الامیین رسولا منهم یتلو علیهم آیاته ویزکیهم ویعلمهم الکتاب والحکمة وان کانوا من قبل لفی ضلال مبین) الجمعة/٢ واتە هەر ئەو زاتەیە لە ناو خەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبەرێکی لە خۆیان ڕەوانە کرد، ئایەتەکانی قورئانەکەی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوەو دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکرا و نادیاریان پوختە دەکات فێری قورئان و دانای و شەریعەتیان دەکات، بەڕاستی ئەوانە پێشتر لە گومڕایی و سەر لێشێواویەکی ئاشکرادا گیریان خواردبوو.

٤- بۆ وەڵامی ڕووداوەکان و چارەسەری کێشەکانی ڕۆژانەی کۆمەڵگە موسوڵمانە نوێکەی ئیسلام، بۆ نموونە ڕووداوی (ئیفك) کە بریتی بوو لە تۆمەتبار کردنی دایکە عائیشە خێزانی پێغەمبەر درودو سەلامی خوای لێ بێ - پەنا بەخوا- بە تۆمەتی زینا ! کە بووە مقۆ مقۆی ناو خەڵکی و مایەی ئازارو ژانێکی بەردەوام بۆ پێغەمبەر درودو سەلامی خوای لێ بێ و ئەبو بەکری سددیقی باوکی عائیشەو بۆ عائیشە خۆی و بۆ هەموو مسوڵمانای تریش. تا الحمدالله ئایەتەکانی قورئان پاکی و بێ تاوانی دایکە عائیشەیان بۆ هەموو مسوڵمانان هێنایە خوارەوە کە تا ڕۆژی دوایی هەر دەخوێنرێن.

٥- وەکو وەڵامی پرسیاری خەڵکی، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ : (یسالونك ماذا ینفقون) البقرة/٢١٥ واتە لە تۆ دەپرسن (ئەی

پێغەمبەر صلی للە علیە وسلم) کە چی ببەخشین و بەکێی ببەخشین؟.(یسالونك عن الخمر والمیسر قل فیهما اثم کبر و منافع للناس) البقرة٢١٩ واتە پرسیارت لێدەکەن دەربارەی عەرەق و قومار، پێیان بڵێ: لەو دووانە گوناهێکی گەورە هەیە، هەرچەندە چەند سوودێکیشیان تێدایە بۆ خەڵکانێك، بێگومان گوناهەکەیان گەورەترە لە کەڵك و سوودیان. وە لەم جۆرە پرسیارانە زۆر دەبینین لە قورئاندا.

٦- بۆ ئەوەی بۆ هەموان بسەلمێت کە ئەم قورئانە لەلایەن خوای گەورەوە هاتووە، ئەوەتا ئەو ئایەتانەی لە یەکەمینساڵدا هاتوونەتە خوارەوە لەگەڵ ئەو ئایەتانەی کە لە ساڵی بیست و سێیەمدا هاتوونەتە خوارەوە هەموویان پێکەوە سازاو گونجاون، چونکە لە لایەن خواوە هاتوون، وەك دەفەرموێ : (ولو كان من عند غير الله لوجدو فيه اختلافا كثيرا) النساء/٨٢ واتە خۆ ئەگەر لە لایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگە لە خوا بێگومان جیاوازی و دژایەتیەکی زۆریان تێدا دەدۆزیەوە.

قورئانی پیرۆز ئابەوشێوەیە بۆ ئەو کۆمەڵگە موسوڵمانە دەهاتە خوارەوە، تا هەموویانی ئاوا پتەو پەروەردە کردو کردنی بەو نەوە تایبەتەی ئیسلام لە مێژووی ژیانی هەموو مرۆڤایەتیدا.

بە ڕاستی ڕاستە کە شاعیر وتوویە تی:

ئەگەر ئەتەوێ زانیاری جیهان    قورئان بکەرە بەرنامەی ژیان

# یادە ئاینیەکان یادی خوا پەرستین

لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا کە دوو جەژنی تێدایە. هەردوو جەژنەکە دوای دووکاری زۆر گرنگ دێن ئەویش مانگی پڕ بەرەکەتی ڕەمەزان و حەجی ماڵی خوایە. ئەوەی گرنگەو دەبێت بیزانرێت ئەم دوو جەژنە دەربڕینی خۆشی و شادیە بەهۆی ئەو دوو کارە پیرۆزەوە، یەکێکیان ڕۆژوو بوونی مانگی ڕەمەزانە کە دوای هیلاکیەکی زۆر دێت لە ڕۆژوو بوون و تەراویح و شەونوێژو قورئان خوێندن، جا بۆیە زۆر جێگای خۆیەتی مسوڵمانان بە هاتنی جەژن دڵخۆش بن پێی و وە خۆشی خۆیانی تێدا دەرببڕن بە جۆرێك کە زیادە ڕۆی تێدا نەکرێت. ئەویش لەبەر ئەوەی کە خوای گەورە موەفەقی کردوون ئەو هەموو کارە خێرەی تێدا ئەنجام بدەن. هەروەها جەژنی قوربان کە دوای بەجێهێنانی فەریزەی حەجە کە ئەویش دوای ماندوو بونێکی زۆر دێت ئەویش بە وەستان لە کێوی عەرەفەو بڕینی ئەو ڕێگا دوورە لە کێوی عەرەفەوە بۆ موزدەلیفەو دواتر بۆ مینا، جگە لەو پاڵە پەستۆو قەرەباڵغیەی کە هەیە مەگەر یەکێك حەجی کردبێت بزانێت چۆنە. جا جێگەی خۆیەتی کە ئەو ڕۆژە دێت خۆشیەکی بۆ بکات بەهۆی ئەنجام دانی حەجەکەیەوەو وە پاك بوونەوەی تاوانەکانی کە هەموو مسوڵمانێك ئاواتەخوازن بۆی. ئەوەی زۆر گرنگ و جێگەی خۆیەتی بیانزانین ئەم دوو بۆنە پیرۆزن چونکە دوای دووکاری پیرۆز دێت کەوا بوو ئەم دوو بۆنە یادی خوا پەرستین و سوپاسکردنیەتی. نەك هەرچی ڕێسە شیان

بکەیتـەوە ئەویـش بەهـۆی سـەرپێچی فەرمانەکانـی خـوای گـەورەوە. زۆر جێگـەی نیگەرانیـە مسـوڵمان هەڵسـێت بـە بەجێهێنانـی ئـەم دووکارە گرنگـە بەهەڵپەڕکـێ و گۆرانـی ناشـەرعی و تێکـەڵاوی یـادی بکاتـەوە؟! چـۆن دەکرێت یادێـك کـە دینـی بێـت و پیـرۆزی تێـدا بێـت، بەسـەرپێچی ئـەو یـادە ڕابگیرێـت؟ ئـەو پرسـیارە دەبێـت هەریەکە لـە ئێمـە بیانکەیـن لـە خۆمـان، نـەك بکەوینـە ژێـر کاریگـەری کۆمەڵانێـك کـە لـە ڕاسـتیدا جـەژن هـەر هـی ئـەوان نەبـووە چونکـە نـە ڕۆژوویـان تێـدا گرتـووەو وە نەحەجیـان کـردووەو نـە باوەڕیشـیان پێیەتـی بەڵکـو ئـەم جەژنـە وەك هەلێـك بـۆ خۆیـان دەقۆزنـەوەو مسوڵمانانیشـی پـێ تاوانبـار دەکـەن بەشـێوەیەکی وا بەڕۆشـتنی ئـەو دووکارە گرنگـە کـە ڕەمـەزان و حەجـە، وایـان لـێ بێـت وا بزانـن تـەواو ئیـتر ئـەوەی لەسـەریان بـووە بەجێیـان هێنـاوەو ئیـتر کاتـی ئـەوە هاتـووە بۆخۆیـان هەرچیـان پـێ خـۆش بێـت بیانکـەن، ئـەوە لەبیـر دەکـەن کـە خـوای ڕەمـەزان و کاتـی حـەج هـەر هەمـان خوایـە لـە ڕۆژی جـەژن و دوای جەژنیشـدا. گرنگـەو وە دەبێـت بۆنـە دینیـەکان وەك خۆیـان بـە پیـرۆزی و گـەورە ڕابگیرێـت نـەك بکرێتـە بۆنەیـەك هیـچ سـیمایەکی دینـی پێـوە دیـار نەبێـت بەنـاو دینیشـەوە؟! خۆزگـە مسـوڵمانان چاویـان بەخۆیانـدا دەخشـاندوو خوایـان لەخۆیـان نەدەڕەنجانـد بەهـۆی سـەرپێچیەوە

# گرنگی گرتنی شەش ڕۆژ ڕۆژوو دوای رەمەزان

دوای بەدوای مانگی ڕەمەزان گەر خوای گەورە مۆفەقی کردی لەسەر گرتن و بەزیندوو ڕاگرتنی ئەو مانگە بە ڕۆژوو عیبادەت و قورئان خوێندن و تەراویح و زیندووکردنەوەی شەوانی قەدر ئەوا تۆ کەسێکیت لەو کەسانەی ژیان و ئایندەیەکی گەش چاوەڕانت دەکات و پێویستە دوعای وەرگرتنی بکەیت کارو کردەوەو ڕۆژووەکانمان مایەی ئەوە بوو بێت کە لە فەرموودەکەدا هاتووە (غفر لە ما تقدم من ذنبە) لە تاوانەکانی پێشوومان خۆش بوو بێت. زۆر گرنگە هەر کات هەر کارێکمان کرد لەبەر خوای گەورە دوای کارەکانمان داوا لە خوای گەورە بکەین خوای گەورە کارەکانمانی وەرگرتبێت. ئەوەتە باوە گەورەمان ئیبراهیم سەلامی خوای لێ بێت وەك قورئان بۆمانی دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ [رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُسْلِمَةً لَكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَا إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ] بقرة ١٢٨ خۆ ئیبراهیم سەلامی خوای لێ بێت تاوانی نەکردووە بەڵکو ئێمە فێر دەکات کە لەسەر ئەوە ڕابێین. نەوەك خوا نەخواست شتێکی وا تێکەڵی نیەتەکەمان بوو بێت بووبێتە مایەی ئەوەی کردەوەکانمان وەرنەگیراو بێت. ئەوەی لێرەدا مەبەستە بخرێتە ڕوو ڕۆژوو گرتنی شەش ڕۆژە لە شەوال بەگرتنی ئەو شەش ڕۆژە خێری ساڵێکی تەواومان بۆ دەستەبەر دەکات ئەمەش هەروەك شەوانی قەدر چۆن ئەو خێرە زۆرەی تێدا دەست دەکەوێت بەم شەش ڕۆژەش خێرێکی زۆرمان دەست دەکەوێت بەگرتنی مانگی ڕەمەزان

خێـری دە مانـگ ڕۆژووی هەیـە چونکـە هـەر ڕۆژێـك بەرانبـەر دە ڕۆژە کـە ئەویـش دەکاتـە دە مانـگ وە شـەش ڕۆژی شـەوالیش هـەر ڕۆژەو بـە قـەدەر دە ڕۆژ ئەویـش دەکاتـە دوو مانـگ واتـە سـاڵێکی تـەواوی پڕ کـردەوە، چونکـە هـەر کردەوەیەکـی چاکـە زیـاد دەکات بـۆ دە، وە بەڵکـو بـۆ زیاتریـش ئەگـەر خـوای گـەورە فەرمانـی لەسـەر هەبێـت. جـا کەوابـوو جێگـەی خۆیەتـی نەهێڵیـن ئـەم شـەش ڕۆژەشـمان لەدەسـت دەربچـی بـۆ ئـەوەی خێـری سـاڵێکی تەواومـان دەسـت بکەوێـت. وە ئـەو ئافرەتانـەش کـە چەنـد ڕۆژێکیـان خـواردووە بەهـۆی عـوزری شـەرعیەوە دەتوانـن قەرزەکانیـان بگرنـەوەو دواتـر شـەش ڕۆژەکـەش بگـرن وەگـەر نەشـیان توانـی هـەر دەتوانـن شـەش ڕۆژی شـەوال بگـرن وە دواتـر قەرزەکانیـان بگرنـەوە. شـایەنی ووتنیشـە زۆرێـك وا دەزانـن ئەگـەر یەکـەم ڕۆژی دوای جەژنـی نەگـرت ئیـتر ناتوانێـت ڕۆژەکانـی تـر بگرێـت بەڕاسـتی نازانیـن ئـەوە لـە کوێـوە هاتـووە. بەڵکـو ئاسـاییە هـەر شـەش ڕۆژ لـە دوای ڕەمـەزان گیـرا ان شـاء اللـە دەچێتـە چـوار چێـوەی فەرموودەکـەوە وەك دەفەرمـوێ [مَـنْ صَـامَ رَمَضَـانَ ثُـمَّ أَتْبَعَـهُ سِـتًّا مِـنْ شَـوَّالٍ كَانَ كَصِيَـام الدَّهْـرِ . ' رواه مسـلم] لـە فەرموودەکەتـا هیـچ ئاماژەیـەك نییـە بـۆ ئـەو تایبەتـی کردنـە.

الحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات

# پێڕست



ئەم نامیلکەی
لەبەردەستاندایە بریتیە لە چەند
ووتارێك كە دەستپێدەكات لە
پێش ڕەمەزان و خۆ ئامادەكردن
بۆی تا ڕەمەزان و ئەو
عیبادەتانەی كە لەناو ڕەمەزاندا
هەیە تا كۆتایی ڕەمەزان و
گرنگی كۆمەڵە كارێك لە دوای
ڕەمەزان و بەردەوامی لەسەر،
چونكە ئاشكرایە مانگی ڕەمەزان
و خۆ حازركردن بۆی پێش هاتنی
و شەوانی قەدرو چۆنێتی هەستان
بۆ جەژن و شەش ڕۆژی دوای
مانگی ڕەمەزان هەموو ساڵێك
دووبارە دەبنەوە، ئەم نامیلكەش
بە ووتاری جیا جیا باس و
خواستی هەموویانی بە پلە پلە
تێدایە، بە ئومێدی سود وەرگرتن
لێیان

# پوختەی
## ڕۆژووی ڕەمەزان
### پەیامی ڕەمەزان (قیبلە)

د. عومەر عەلی

٢٠١٨